زانكۆی سه لاحه دین هه ولێر
Salahaddin University-Erbil

# گوڵ و جۆرەکانی گوڵ لە شیعرەکانی نالی

## پروژه ی ده رچوونه

پیشکه ش به به شی زمانی کوردی کراوه. وه ک به شیک له پێداویستیه کانی به ده ستهێنانی بڕوانامه ی به کالۆریوس له زمانی کوردی


ئاماده کراوه له لایه ن:

**مهابات جعفر عبدالله**

به سه رپه رشتی:

**م. مهدی سه ربه ست سلیمان**


**ئایار-** 2020

## پێشکه ش:

ئەم توێژینە وەیە پێشکەشە بە :

ـ بـــــه خۆشـــەویـسـتـانـم .

ـ بـــــــه هـــــەموو ئـــــازیزانم بـــــه تــــایبەت دایـــــکی خـــۆشەویستم کــــه هــــەموو ژیــــانی بـۆ ئیمە  تە رخان کـردووە لـە جێگای باوکیشـم .

ـ بـــــه خوشـــــــک و بـراکـانـم .

ـ بــە هــاوریێ ی خۆشەویستم ( شیلان عبدالله ) کە زۆر یارمـەتی داوم .

**سوپاس و پێزانین :-**

ــ سوپاس خـــودای گـەورە کـە تـەمـــــەنی داوم بـۆ گەیشتـــن بـــــــەم قۆناغــە .

ــ ســوپاسی ئـەو مــامۆستا بــەرێزانە دەکەم کــە بــە درێــژایی ژیــانم یــارمـــەتیان داوم وەفێـــری زۆر شتیـــان کـــردووم .

ــ سوپاسی دایک و باوکم دەکەم ، کە هەردەم پشت و پەنام بوونە لە ژیانـم دا .

ــ زۆر سوپاســـی مامۆســـتای بـــەرێز ( مهـــدی ) دەکـــەم کـــە ئـــەرکی سەرپەرشـــتی کردنـــی لێکۆلینەوەکەی گرتە ئەستۆ .

ــ سوپاسی هـــــەموو ئـەو کـەسانەی کە یـارمەتیـان داوم .

ــ سوپاسی ســـــەرجەم مـــامۆستایانی کۆلێژی پەروەردەی مەخمـور .

## پێڕستی توێژینه وه

عنوان لاپه ڕه

## پێشەکی : -

ئەم لێکۆلینەوە لە ژێر ناونیشانی ( گوڵ و جۆرەکانی گوڵە لە شیعرەکانی نالی ) دا رومال کردنی گوڵە بە شێوەی گشتی ، هەرچەندە گوڵ بە شێوەیەکی گشتی رەنگی داوەتەوە ، بەلام لای نالی زۆر تایبەت و بێ وێنەیە ، چونکە وەک هۆیەکی بە هێز بۆ گەیاندنی پەیامی شیعرەکانی هانای بۆ بردووە هەر بۆیە گول و جۆرەکانی گولم لە شیعرەکانی نالی دا هەلبژاردوە بۆ ئەم باسەم کە هیوادارم توانیبیتم خزمەتێکی بچوک لەو بوارە پێشکەش بکەم ...

## گرینگی بابەت :-

کە سروشت بە گشتی و گوڵ بە تایبەتی پانتاییەکی فراوانی لە شیعرەکانی نالی دا داگیر کردووە ، ئەمەش جێگای هەڵوەستەو تێروانینی وردە ، چونکە هەڵقولاوی ناخ و دەرونی شاعیر لەلایەک و گوڵ وەک سروستێکی جوان بەیەکەوە مەبەستی شیعرەکان تەواو دەکەن .

## بەشی یەکەم :

## ژیاننامەی شاعیر نالی

شاعیری گەورەیی گەلەکەمان نالی ناوی تەواوی) مەلا خدر ( خزرە ) کوڕی ئەحمەدی شاویسی ئالی بەگی میکائیلیە ناسراوە بە نالی لەگوندی ( خاک وخۆل ) لە دەشتی شارەزوور لەدایک بووە { شاویسی میکائیلی ، 1390: 23 }

سەبارەت بە ژیان نامەی شاعیر نالی لایەنێگی گرینگی ژیانی شاعیر پەیوەست بووە بە شیعرەکانی لە رووی ئەدەبیەوە گرینکیەکی زۆری هەبووە ، بەلام لە ژیانی دا چەندین شارو دێهات گەراوە وە بەناوبانگیرین شاعیر بوە لە شێوەزاری کوردی دا . شاعیر بەردی بناغە و دامەزرێنەری قوتابخانەی شعری بابانە و لە یەکەمین و بە ناوبانگترین شاعیرانی شێوەزاری کوردی ناوەندیە ، هەر لە تەمەنی مندالی زانستەکانی ترو قورئان و فەرمووده و سرف و نەحو کەلام و بلاغەی خوێندیەتی تا خوێندنی ئەمانەی تەواو کردووە ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە ، لە چەندین شوێن کە تیایدا مابێتەوە وەک ( سنە و سابلاغ و هەلەبجە و سلیمان لای چەندین مامۆستای باشی ئەو سەردەمەی خوێندوێتی ) .

دوای تەواو کردنی خوێندنەکەی نالی مەلایەکی باش و رۆشەنبیرێکی گەورەی لێ دەردەچێت و نالی لە ژیانی دا دیالیکتی بووکی سلیمانی ( بابان ) ی کردووە بە بنج و بنەوانی زمانی ستانداری نووسین و کرمانجی باشوور یەکەم رۆشەنبیر بووە کە کەڵکی زۆری لە کرمانجی باشورو دیالیکتە بچووکەکان وەرگرتووە وەک سۆرانی و موکریانی و ئەردەلانی { مارف خەزنەدار ، 2008 : 30 }.

هەروەها نالی کەلکی لە دیالیکتەکانی دیکە وەرگرتوە وەک ( کرمانجی باکور و گۆرانی ) { مارف خەزنەدار ، 2008 : 30 }. شوێنەواریان لە شیعری دا دەکەوێتە بەرچاو .

بێجگە لە زمانی دایک زمانی شیرینی کوردیە زمانەکانی فارسی و تورکی و عەرەبی بە باشی زانیوە تەنانەت شعریشی پێنووسیوە هەروەها نالی هەموو هۆش و بیرو خەیاڵ و بلیمەتی ژیانی خۆی تەرخان کردووە بۆ زمانی کوردی .

## سەبارەت بە ساڵی لە دایک بوون و مردنی شاعیر ( نالی )

شاعیران چەند بۆچوونێکی جیاوازیان خستۆتەروو سەبارەت بەسالی لەدایک بوون و مردنی وەک شاعیر ( مەحەمەد ئەمین زەکی بەگ ) ئەلێت نالی لەسالانی ( 1215 – 1273 ) ی ک دەکاتە ( 1800 – 1856 ) ز ژیاوە .

د.مارف خەزنەداریش هەمان بۆچوونی هەیە ، هەروەها د. کەمال فوئادیش .

مامۆستا عەلائەدیین سەجادیش ئەلی سالی ( 1797 -)ی ز هاتۆتە دونیاوە وە لە سالی ( 1855 ) ز کۆچی دوایی کردووە .

هەموو ئەو شاعیرانەی مێژووی لە دایک بوون و مردنی نالیان وەک یەک داناوە و بەو پێیەی نالی تەنها ( 56 ) سال ژیاوە هەروەها هۆی یەکنەکەوتنی مامۆستا سەجادی لەلایەک و دکتور مارف خەزنەدار و دکتور کەمال فۆئادوو دەربارەی تەمەنی سالی لەدایک بوونی نالی ئەو بەراورد کردنەی کوردی و مەریوانی بەدوای ئەوانیش مامۆستا عەلی موقبیلە کە لەسالی ( 1215 )ی ک بەرامبەر سالی ( 1797 )ز بەراورد کردووە بەپێی ئەم شاعیرانە ئەگەر وابێت وەک کوردی و مەریوانی و موقبیل و سەجادی ) دەلێن نالی (58 ) ساڵ ژیاوە ، بەلام بەبۆچوونی رۆژهەلات ناسی ئەرمەنی سۆفیەتی یوسف ئەبگارا ڤیچ ئۆربیلی دا لەسالی ( 1215 )ی ک بەرامبەر سالی ( 1800 – 1801 ) ز کراوە .
بەو پێیەی کە دکتوۆر کەمال و مارف خەزنەدار کەلەسەری رۆیشتوون ساڵی لەدایک بوونی نالی دەکاتە سالی ( 1800 )ی ز تەمەنەکەی دەبێتە ( 56 ) ساڵ . { شاوەیسی میکائیلیە ، 1390: 16 }
هەروەها ( بەڵگەی تریش هەیە کەوان شاعیر نالی زیاتر لە ( 58 ) ساڵ ژیاوە ، بەلام لەبەر ئەوە کە ئێمە لەم باسە دا تەنها شیعری دەکگەین بە بەڵگە ، باسی ئەو بەڵگانە ناکەین . بۆیە بە بۆچوونی زۆربەی شاعیران کەوا نالی پتر لە ( 58 ) ساڵ ژیاوە ) { مەلا کەریم ، 2009 : 15 }

لەوانەی کەباس کران هیچیان ناتوانرێت وەک سەچاوەیەکی راستەقینە و باوەر پێکراو سالی لەدایک بوون و کۆچی دیاری بکەن . هەر چۆنێک بێ هەر سالێک بێ خامە و ئەفسانەی نالی هەمیشە درەوشاوەو دەبێت لە نێو شعرو ئەدەبیاتی کوردی و ، هەر بە دەولەمەندی و بەهرەی ئەم شاعیرە مەزنە لە نێو ئەدەبی کلاسیکی دەمێنێتەوەو کار لە گەورەیی و بەهرەی ئەم شاعیرە ناکات .

## ژیان نامەی شیعری لە رووی زمانیەوە

نالی وەکو شاعیرێکی دەست رەنگین و بلیمەت توانیوویەتی زۆر لێهاتووانە شعر بنووسێت کە لەگەل سەردەم و چەرخی ئەو کات دا بگونجێت و جوانترین پەیام بگەینێت و کاریگەری ئەرێنیانەی لە دوای سەدان سالانەی خۆشی بەجێ بهێلێت لە رووی زمانی شیعرییەوە ) تێکەل بووە لەگەل زمانی عەرەبی و فارسی و تورکی و ووشە گەلێکی ئەم زمانانەی تێدابووە هاوشان لەگەل ووشەی کوردی بەتایبەتی زاراوەی ئایینی و وەکو فیقەو ئسولی دین و مەنتیق و فەلەک بەشێوەی اقتیباس و تەلمیع بەکارهێناوە) { شاویسی میکائیلی ، 1930 : 36 } .
رەنگ دانەوەی ئەم کاریگەریە زمانیەش بۆ ئەوە دەگەرێتەوە کە کاریگەری ئایینی ئیسلام لەناخ و دەروونی رەنگی داوەتەوە ، هەروەها زمانی تورکی و فارسی و عەرەبی کاریگەری هەبووە لەسەر شیعرەکانی ، نالی لەو سەردەمە زۆر بەچاوێکی رێزوو خۆشەویستی شانازییەوە شیعری بە کوردی نوسیوە .

## کاریگەری شاعیرانی فارس لەسەر نالی

ئەوە سەلمێنراوە کە پێشتر ئەدەبی عەرەبی کاریگەرتر بوو لەسەر نالی ، بەلام ئەمە بۆ ئەو کات دەگەرێتەوە لەسەردەمی باشوری کوردستانی عێراق دا بووە ، کاتێک کە کتێب و چاپەمەنیەکان دا هێنانی ناوی فارسی (بڤ )ە بوو بێت لەلایەکی ترەوە مامۆستا مەلا عبدالکریمی مودەریس پەیوەندی بە عەرەب و فەرهەنگی عەرەبی هەبووە بۆیە کاریگەری کردۆتە سەر ئەم زمانە ( نالی لە شیعرەکانی دا وەک شاعیرێکی کلاسیکی ووشە گەلێکی فارسی بەکار هێناوە و ئەگەر ووشەی عەرەبیشی بەکار هێنا بێ ئەو ووشانە کە عەرەبین لە کوردی و فارسی بەکار هێنانیان زۆرە نالی نەک لە دیوانەکەی دا بەلکو لە دیوانی هەموو شاعیرانی کلاسیکی کوردی دا ووشەکانی هەیە ناتوانین مورکی فارسی بوونیان بێوە بلکینین ، ئەوەش دەگەرێتەوە بۆ هاو رەچەلەکی زمانی کوردی و فارسی ) . { نەقشبەندی ، 7 }

نالی لە دیوانەکەی دا چەندین غەزەلی بە زمانی فارسی هەیە لەو پەری جوانی و ناسکی دایە هۆگری شێوازی ئەدەبیاتی فارسییە ( لە غەزەلەکەشی دا جوانی و پاراوی نزیکە لە شاعیر حافیز و سەعدی یەوە ، هەروەها کاریگەری زمانی شیعری نالی لە زمانی شیعری نزیکە وەکو خاقانی و انور و بیدل و صائب ) { هەمان سەچاوەی پێشوو : 8 }

شیعرەکانی نالی زۆر لە شیعری ئەو شاعیرانە دەچێت لە تابلۆی شیعری شاعیرانی لێ بەدی دەکرێت ، بەلام مانای ئەمە نیە کە نالی شیتێک لە کەسێک یان کەسێک لە نالی ئەمە بەمانای چاو لێکردنی کوێرانە نایەت بەلکو تەنها گۆرینەوەی احساس و عاتیفە و زمانی شیعریە لەدەوران شێواز و سەبکی هندی بری لە شاعیرانی ئەسپەهان روویان کردە هندستان ( کارێگەری شیعری ئەسپەهان لەسەر شیعری شەقارە ی هندستانەوە . لەشیعری شاعیرانی سەبکی خۆراسانی دا بە تایبەت

شیعرەکانی منو چهری ، کاریگەری زمان و شیعری عەرەب بەسەریانەوە دیارە ) { هەمان سەچاوەی پێشوو : 11 }.
بەلام لە غەزەل و قەسیدەی فارسی کاریگەرتر بووە بەسەر نالی ، لە شیعری عەرەب ئەمەش بۆ یەک بوونی زمانی فارسی و کوردی دەگەرێتەوە .

نالی وەک شاعیرێکی مەزن لە رووی زمانی شیعری دا تێکەلاوی لەگەل شاعیرانی فارسی هەبووە ، تێکەلاوی زمان بۆتە پەیوەندییەکی بەهێز لە نێوان شاعیرانی جیهان ( ناسینی تێکەلاوی زمانی شیعری ئەوەمان بۆ دەردەخات کە پەیوەندییە فەرهەنگەکان وەک کرێ کوێرەیەکە کەزۆربەی گەلانی جیهانی بەیەکەوە بەستۆتەوە نالیش یەکێکە لەو شاعیرە پایە بەرزەی گەلی کورد کە تێکەلاوی هەیە لە رووی زمانی شیعری لەگەل زمانی شاعیرانی فــــارسی دا ) { هەمان سەچاوەی پێشوو : 2 }.
هەروەها خالە بە هێزەکانی شیعری نالی لەگەل ئەو تێکەلاوییەی زمانی شیعری هەیەتی بەرامبەر خالە بەرچاوەکانی زمانی شیعری (غنائی ) فارسی دا هەیە بخرێتەروو .
( زمانی پەسن ( مدع ) لە شیعر دا دیارە بەپێ ی سەردەم و قۆناغی ئەو کات دا لەدوای هاتنی ئیسلامەوە بووە ، لەروی شێوازی سەپکی خوراسانی دا ) { هەمان سەچاوەی پێشوو : 3 }
زمانێکی بە توانای هەبووە زۆربەی قەسیدەکانی لەساییەی ئەو شێوازە بووە ، هەروەها شێوازی سەپکی عێراقی دا شاعیر زیاتر باسی گەورەیی و شکۆمەندی ئەو کەسە ( مەمدوع ) دەکات کە ستایشی کردووە ، بەلام کەمتر درێژە دەدات بە کەلام وە لە ( غەزەل ) دا ستایشی زیاتر لەیەک بەیت یان دوو بەیت دەبێت لە شیعرەکانی نالی دا ستایش کردن کورتترە بێ زیادەرۆییە چونکە زمانی ستایشی نالی زۆرتر لە زمانی ( حافزی ) نزیکترە ، وادیارە شاعیرانی کورد کەمتر لە شیعرەکانیان ستایشیان کردووە ، زیاتر ستایشی ( پێغەمبەرو ئەسحاب و گەورە پیاوانی دینیان کردووە یان ستایشی حاکم و دەسەلات دارانیان کردبێت لە رووی هەستی نەتەوایەتیەوە ، نالی لەکاتی فەقێیەتی دا بە دوای علم و زانین دا لە کوردستان دا گەراوە لەوکاتەدا هەژار بووە دەستی بۆ هیچ حاکمێک دریژ نەکردووە ، نالی ستایشی ئەو کەسانەی کردووە لە خۆی نزیکن وەکو شاعیرانی دەربار نیە بۆ کەس شیعرەکانی خۆی هەرزان فرۆش نەکردووە .
شیعرەکانی پایەبەرزی پێوە دیارە زیاتر ستایشی عاشقانە بووە و لەوپەری جوانی و بەهێزی دا یان شیعرەکانی دڵداریەکی مەجازی بووە شیعرە دڵداریەکانی لە جنسی مێینەن ، بەلام شاعیرانی فارس کە ستایشی مەعشووقی هاوجنسی خۆیان کردووە نالی شاعیرێکی سۆفی نەبووە ، بەلام زیاتر تەریقەتی نەقشبەندی هەبووە حافزیش شاعیرێکی عاریفانە نەبووە کەسێکی شەریعەتانە بووە نەک عاریفانە شیعری نالی و حافزی زیاتر باسی خۆشی و شادی و عاشقی و دلداریە کەمتر باسی فیراق و دووری یار دەکات ئومیدی بە وەصل دەدات بە شیعرەکانی ، هەروەها نالی بۆ جوانی شیعرەکانی رێبازی علمی ( بەدیع ) بەباشی زانیوە کەلکی لە ( جیناس ) وەرگرتووە دیارە لەم بوارە دا زمانی شیعری نالی زۆر لە زمانی شیعری خاقانی دەچێت .

## بــەرهەم لە شیعری نالی

لەرووی بەرهەمەوە ئەو کارەی کە شاعیر دەیخاتەروو بەرهەم و توانی ئەو کەسەیە ، شیعری نالی لە رێرەوو باو گشتییەی خۆی دا لە کلاسیکەوە سەرچاوەی گرتووە ، خستنەرووی بەرزی بەرهەمەکانی نالی لە شیکردنەوەی شیعرەکانی لە چەندین رووەوە رەگەزی نوێ دا بە دی دەکرێت ، کە ئەویش بەشێکە لە تایبەتمەندییەکانی بەرهەمەکەی ئەکەوێتە بەرچاو ، کەبەهۆیەوە دەتوانرێت شیعرەکانی نالی لەبەرهەمی شاعیری تر جیا بکرێتەوە نالی بە گشتی وەکو شاعیرێکی بە توانا ووشەکاری بەکار هێناوە ( دەکرێت کە شیعرەکانی نالی بە شیعری تازە دانەنرێت ، چونکە رێبازی کلاسیکە و سروشتی ئەو رێبازە ئەوهایە ، یان بە ئەدەبیاتە کلاسیزمەکەی بە کرمانجی ژووروو دادەنرێت ، لە سەدەی حەڤدەهەم پەرەی سەندووە ، یان رەنگە هەندێکی تر بە وێنەیەکی کوردی شیعری کلاسیزمە رۆژهەلاتی ببینن و تازەیی تایدا نەبینن ) { ابراهیم ، 2016 ، 2017 : 2 } بەلام ئەمانە هەموی لە راستییەوە دوورن ، چونکە نالی ئەگەر هیچی نەکردبێت ، ئەسپی خۆی تاو داوە لە نیشاندانی هێزو توانای زمانی کوردی لە داهێنانی ئەم زمانە لە دەربرین دا ، لەناو زمانی کوردیش دا بە پیت و دیالیکتەکەی خۆی لە رووی ووشە گەلەوە وای نیشان داوە ، ووشە لای نالی گەلێک مانای هەبووە ، خەریکی ووشەکاری و رازاندنەوەی ووشە بووە ، خەریکی مانا بەکارهێنانی ووشە بووە ، بەلام ووشە کاری لای شاعیران دیمەنێکی تر بوو بێت لە دیمەنەکانی توانای ئەدەبی خۆیان ، لای ئەوان بۆ کات بەسەر بردن بووبێت ، لای نالی ماناو مەبەستێکی قولتروو فراوانتری بەکار هێناوە ، نالی کە شاعیرێکی رۆژانی گەشەسەندنی میرنشینی بابانە ، ئاگاداری هەموو ئەوو تەم و مژەیە ، کە لەکۆمەڵگەی سلیمانی بەدیار کەوتووە ، ببێتە ئاسۆیی فراوانی یەک پارچەیی کوردستان ، ئەم شاعیرە ویستویەتی ووشەی کوردی ببێتە بناغەی ووشەی ناوچەی خۆی و وە ببێتە بەشێک و بگاتە ئەو پەری سنوری کوردستان ، ئەگەر ئێمە ئەمرۆ ووشەو مانای شیعری نالی بە کۆن دابنێین ، چونکە لە پاش وی زۆر دووبارە کراوەتەوە ، لەکاتی خۆی نوێ بووە .

## مەبەستی شیعری لای نالی

هەر وەک کە شیعر لە روخسارو ناوەرۆک پێک دێت ( ئەوەی مەبەست و حالەتەکانی شاعیر لە خۆ دەگرێت پێ ی دەوترێت ناوەرۆکی شیعری) { مەلا زادە ، 2016 : 406 } ئەمەش کۆمەلی بابەتی هەمە رەنگ لە خۆ دەگرێت .

نالیش وەکو شاعیرانی تر کلاسیک مەبەستە شیعرییەکانی رەنگ دانەوەی ژیان و گوزەران و باروو دۆخی کۆمەلایەتی ... هتد بووە ( پر بوون لە دیمەنەکانی ژیانی کۆمەلایەتی و شارەزا بوون لە زانست و هونەروو رۆژگاری خۆی ئەم مەیدانانەی هەمووی پێچاوەتەوە و کوردایەتی بە یەکێک لە گۆرەپانە مەعنەویەکانی نالی و جیهانی دەروونی خۆی ) . { مەحەمەد ، 2007 : 83، 84 }.

## لەم رێگەیــەوەش پەیامی دەقی شیعری خۆی گەیانــدووە وەک ئەم مەبەستانەی خــوارەوە هەندێکــیان دەخەینــە روو :-

1- دلداری :-

بەشێکی زۆری شیعرەکانی نالی پێک دێنێت ( بۆیە شارەزایانی ئەدەبی کوردی وای بۆ دەچن ئەو سۆزو هەستەی لە شعری نالی داهەیە ، سۆزی دلداریەکی راسەقینەیە ، یان وەکو هەموو شاعیرانی کۆن بۆ پیشاندانی توانای شاعیرە ) { مەلا زادە ، 2016 : 406 } هەر چۆنێک بێت نالی زۆر هەستێکی دلداری پاک و جوان لە ناخی دەقی شیعرە دلداریەکانی رەنگی داوەتەوە .

2- ستایشی ئایینی :-

جوانتــرین و پــر هــەستــرین شــیعری بـۆ ســتایش کردنــی پێغەمبــەروو خــاکی مەدینــەی منــــەوەرە دەربــریوە .

3- نیشتیمان پەروەری :-

وەک شاعیرانی تر نالیش خۆشەویستی بۆ خاک و نیشتیمان بوێرانە هەستی نیشتیمان پەروەری خۆی دەربرێت ( نیشتیمان پەروەری دەچێتە قالبی کلاسیزمی نیشتیمان پەروەرییەوە ) { ابراهیم ، 2016 ، 2017 : 8}

شانازی کردن بەخاک و زمانی کوردی بە روونی لە پەیامی شیعری نالی دا دەردەکەون .

4- وەسفی سروشت :-

بەشێکی گرینگ و دانەبراوی شیعرەکانی نالی پێک دەهێنێت زۆر هەنەرمەندانە تابلۆی رەنگا و رەنگی شیعری پیکیشاوە ، بە جۆرێک رەنگ دانەوەی هەبووە لە دەقە شیعرەکانی تایبەت بەم بابەتە بەروونی دەردەکەوێت وێنەیەکی ناوازەی سروشتی پیشان دەدات .

**روخسارو خاسیەتەکانی هۆنراوەی کلاسیــزمی لە شیعرەکانی نالی :-**

1- کێشی عەرووزی عەرەبی بەکار هێناوە .

2- هەموو پارچە هۆنراوەکانی یەک رەوییەو قافیەیە و سەروایان هەیە ، واتە هەموو دێرەکان بە یەک پیت کۆتاییان هاتووە یەک سەروایان هەیە .

3- یەکێتی بابەت لە شیعرەکانی پەیرەو نەکراوە ، بەم شێوە زۆر جار لە تاکە دێرێک دا مانایەکی تەواو دەبینرێت ، کە کاتێک دا کە لە شیعری نوێ دا بە هەموو پارچە شیعرەکە ئینجا مانایی تەواو دەدات .

4- هەموو ئەو ووشە کاریانەی کە بەکاری هێناوە ، لە هونەری رەوان بێژی دا بەکار هێنراون ، قوتابخانەی نالی بەهەموو روخسار و ناوەرۆکییەوە ، تا سەرەتای سەدەی بیستەم بەردەوام بوو ، لەرووی زمانیشەوە تا ئێستا بەردەوامە . { ابراهیم ،2016 ، 2017 : 8 }

5- ( نالی ئەو ریتم و کێشانەی بە کاری هێناوە شیعری پێ هۆنیتەوە ) { نەقشبەندی ،6 }

ئەو کێشانەی نالی کەڵکی لێ وەرگرتووە لەو وەزنانە دەچێت کە شاعیرانی شێوازی سەبکی ( عێراقی ) بەتایبەتی حافیزی و سەعدی شیعریان پێ هۆنیتەوە . نالی زیاتر شیعرەکانی لە بەحری ( هەزەج ) زۆرتر تیادا بەکار هێناوە ، شاعیرێک بووە کە پێدەچێت ژیانی دوور لە تالی و سوێری بەسەر بردبێت و کەمتر فیراق ودووری یاری کێشا بێت ، بەحری هەزەج بەحری شادە .

هەروەها لە شیعری فارسی دا ، شاعیر گەلێکی زۆر ( تضمین و ملمع ) یان بەکار هێناوە ، بەلام لە مضارع دا یەکیان دوو دێردا لەکاتێک دا نالی تێکەلاویەک و جوانی داوە بە ووشەکان .

نالی وەکو شاعیرێکی بە توانا چەندین ( غەزەل و قەسیدەی هەیە) لە پێش چاپ کردنی دیوانی نالی کۆراوی رۆژی کورد ( دە ) پارچە غەزە لی نالی دیارە لە ژێر ئەو شاعیرە مەزنە ( شەهیر حەزرەت نالی ) بلاوکراوەتەوە ، لەبلاوکراوەکانی بەرهەمی شیعری نالی دا ، وەکو دەرکەتووە لە شاعیرانی تر بەختیار تر بووە ، ئەمەش بۆ ئەوە دەگەرێتەوە لێهاتوو گەورەو ناوبانگ بووە ، هەموو شاعیران پەیرەوی شیعری ئەویان کردووە  { خەنەدار ، 2008 : 5، 6 ، 9 } چونکە غەزەل و قەسیدەکانی نیشانەی هەرە بەرزی شیعرەکانی خۆی بووە ، بۆیە نالی لەناو شاعیرانی کوردی دا جێگای پەنچەی دیارە لە شیعرەکانی دا ئەمەبەش بۆتە هۆی ئەوەی ئەم هەموو چاپەی دیوانی نالی بکەوێتە ناو نامە خانەی نەتەوەی کوردەوە . نالی لەرووی قالبی شیعرییەوە چەندین قالبی شیعری هەیە وەک ( قەسیدە ، غەزەل ، موستەزاد ، تاکو فەرد ) .

**بەشی دووەم :**

## سروشت لەنێو شیعری شاعیرانی کورد دا

سروشت پانتاییەکی فراوانی شیعری زۆربەی شاعیرانی داگیر کردووە و رەنگ دانەوەی لەسەر شاعیران هەبووە ، بۆیە زۆربەی شاعیران جوانترین وێنەیان بۆ شیعرەکانیان بەرجەستە کردووە چ بە مەبەستی ستاتیکی یاخود پتەو کردن و گەیاندنی دەق ، ئەم وێنە کردنەش ئاوێتەی کەرەستەی جوان کراوە بۆ ئەمەش هانایان بۆ سروشت بردووە ، وەک سەرچاوەیەکی جوان و ئیلهامی شیعری لەنێو سروشت دا گوڵ پشکی شێری بەرکەوتووە وەک کەرەستەیەکی بایەخ دار سەیر کراوە . (مەبەست لە سروشت رەنگدانەوەی رەگەزو دیاردەکانی سروشتە لە وێنە شیعریەکانی ( نالی ) دا رۆلی بەر چاویان هەبووە هەر لەسەرەتایی پەیدا بوونی مرۆڤەوە ، جونکە سروشت سەرەنجی مرۆڤی بۆ لای خۆی راکێشاوە ) { حەمە ، 2001 : 42 } . بیر کردنەوەی سەرەتایی مرۆڤ بۆ سروست ، بیرکردنەوەیەکی ئەفسانەی بووە ، لێ تینەگەیشتووە بۆیە بەهەر شێوەیەک بێت ویستویەتی خۆی لەگەل بگونجێنێ هەر بۆیەشە بۆ هەر دیاردەیەک خاوەندێکە بۆ داناوە ، ئەو نەیزانیوە کەونە چۆن دروست بووە بۆیە ئەفسانەی بۆ دروست کردووە .

هەروەها گوڵ وەک سەرچاوەی ئیلهامێکی جوانی پر لە ئیستاتیکی مامەڵەی لەگەل دا کراوە ، بۆیە لە رووی بەکارهێنانەوە تەنها وەکو کەرەستەیەکی زمانی و مەبەستێی رووتی ئاساییە نیە ، بەلکو پەلی هاوێشتووە کۆمەلێ مەبەست و تێکەل بووەو بە بیروو هەست و رەنگ دانەوەی باری دەروونی مرۆڤەوە لە هەموو قۆناغێکی شیعری دا بە بێ جیاوازی شاعیران بە بایەخەوە گوڵیان بە هەموو جۆرێک بە کار هێناوە بەمەبەستی گەیاندنی پەیامی شیعری .
( گول لە وێنە شیعریەکانی نالی دا شوێنی دیاریان هەیە ، هەروەها شاعیر چەند جۆرە گولێکی لە وێنە شیعریەکانی دا مەزراندووە لەبارەی روانینی نالی بۆ گول ) { هەمان سەچاوەی پێشوو ، 2001 ز: 42 } گوڵ بە جۆرێک ئاوێتەی شیعر بووە تابلۆی رەنگاو رەنگ و رازاندنەوەی لێ دروست کردووە ، بۆیە لێک جیا کردنەوەی شیعر و گول سەختە ، چونکە بە درێژایی هەموو قۆناغەکان بە گرینگ و پێویست سەیر کراوە .

( نالی ) یەکێکە لەو شاعیرە کلاسیکیانەی زۆر بلیمەت بووە و گۆلی وەکو گەوهەرێکی بریقەدار لەبەرهەمی شیعری خۆی دا بەکار هێناوە کردویەتی بەسەرچاوەی تەسلیمێکی جوان و قەشەنگی شیعری .

سروشت خۆی یەکێکە لە باسە فراوانەکانی ئەدەبیانی جیهانی و بە شێوەیەکی گشتی رەنگی داوەتەوە لە نێو بەرهەمی شاعیران و نووسەران .

لەئەدەبی کوردی دا لە هەموو قۆناغەکان دا سروشت کاریگەری فراوانتر کردووە ، بۆ نموونە شاعیرانی کلاسیکی کوردی وەکو ( مەلای جەزیری ، نالی ، سالم ، کوردی ، مەحوی ، دیلان ، هێمن ، گۆران ، پیرەمێر ، مەولەوی ... هتد لە سروشت دواون ) { محمود ، 2007 : 9 }

سروست بەشێک بووە لە فانتازیای شیعریان ، ((نالی )) یش وەکو یەکێک لە شاعیرە کلاسیکیەکان کە سروشت رەنگدانەوەی بەرچاوی هەبووە لە شیعرکانی دا ، کە دیمەنێکی جوان رازاوەی بە شیعرەکانی دا بەخشیوە بۆتە هەوێنی شیعرەکانی لە نێو دیمەنی سروست دا گوڵ جۆرەکانی بەکار هێناوە .

نالی ووشەو وێنەی بەکار هێناوە بەرامبەر گوڵ بۆ سوود وەرگرتن لە کوڵ لە گۆمەلێک جوانی و رەهەندی و قەشەنگی و درەوشاوە لە خۆ دەگرێت ( کاتێک نالی گوڵی بەکار هێناوە لە جیاتی خستۆتیە بە شوێن چاوی حەبیبە ، نالی بە واتای خەیلی توانج لێدەرەکان مەحوا دەکات ) { مەلا زادە ، 2016 ز : 349 } لێرە دا نالی خۆی لە خۆی دا ووشەی گوڵی لە زۆربەی دێرە شیعرەکانی بە کار هێناوە وەکو چاوی خۆشەویستەکەی وروژێنەرێکی سروشتی کاتێک زانیاری بەرامبەر بە ووشەی گول هەبێت ئەو زانیاریە بەرامبەر بە گوڵ لە زەینی بێتە پێشەوە باسکردنی لە رووی سیفەتە جوانیەکە و ناسکیەکەو مالە جوانیەکەیەوە لە مێژووە رێرەوی گرتوە و کەڵەکەی کردووە لە نەستی کۆی مرۆڤ دا ، گوڵ سەرەرایی سروستی جوانیەکەی دوو جوانی هەیە جوانیەک لە نا ئاگایی کۆمانەوە سەرچاوەی گرتوە ، ئەو جوانیە سروشتیە لە رێگای هەستەکانمانەوە لە سروشت دەیبینین ، ئەو وێنەو جوانیەی لە گوڵ داهەیە ، کە مرۆڤەکان بیریان بۆ دەچێت لە ئاستێکی بێ ئاگاییەوە دەیانهێنێتە ئاساتی ئاگایی .

**بەشی سێیەم :**

## گـــــوڵ و جـــــۆرەکـــانی گـــوڵ لە شیعـــرەکانی نـــالی

### گـــــوڵ

-1

گـــــوڵ تاجی لەســـەر نـاو چەمـــەن مەخمەلی پۆشـــی
هــــــــات موژدە کە خەلعــــــەت گەییــە بەر موباهـــــات
{ شاویسی میکائیلی ، 1391 : 141 }

-1 لـەم دێـرە شـیعرەدا هـاتووە گـولێکی تـازە پشـکوتووە ، چیمـەن بـەرگی سـەوزە گیـای وەک مەخمەل ناسکی لەبەر کرد و موژدە هات کەوا خەلاتی بەهارە وەکو گژو گیا و گوڵ هاتە بەرەوە .

-2

گـــــــــــوڵ بـــدەم باجی سەبـــاوە پێکەنی یەعنـــی وەرە
تـــــــۆ لە وەسلـــم بۆ بـــەرە ، ئەو بۆیە بولبـول شیـن دەکا
{ حەمە ، 2001 ز : 52 }

2ـ مەبەستی ( نالی ) لێرە دا گوڵ سیفەتی مرۆڤی پێدراوە ئـەویش پێکەنینـە نـالیش ( شـنەی ) گول بـە دەم بـاوە پێکـەنینی پیشـانداوە ، خونچـەش دەپشـکوی دەبێتـە بـە گـوڵ و بـۆنی خـۆش بـلاو دەکاتـەوە ، بەلامم نالی باس لە کول و یار دەکات دەلێ وەرن بۆنی خۆشی یار لە منەوە وەرگرە بلاوی کەرەوە.

-3

دەستـــــی چنـــاری رووت و ، ســـــەری شـــاخ و ، لێــوی گوڵ
رازانــــــــــەوە بـــــە خەلعــەتــی دیباوو بەرگ و تـــــــــوک
{ هەمان سەر چاوەی پێشوو ، 2001 ز : 54 }

-3 لەم دێرە شیعرە دا بە دوو دیمەن بەدیار دەکـەوێت یەکـەمیان لـەوەرزی زسـتان دا درەختـەکان گەلایان پێوە نیە دەوەریت و شاخەکان بەفر سپی بـوون ، خونچـەش هێشـا نەپشـکووتووە ، لـە دوایـش دیمەنەکـە لـە وەرزی بـەهار دا دەردەکەوێتـەوە ، بـەلام بـە پێچەوانـەی درەختـەکان گـەلایان گرتـووەو شاخەکان بە گیای سەوز داپۆشراون خونچەش پشکوتوە و بووە بە گوڵ.

4-

مـــــــاوەردە لەســـــەر خـــــەرمەنـــی گوڵ عەگر فشانــــە
یــــــــا ئــاوی حەیاتە : عەرەقــی وردی موحەییــــــات
{ هەمان سەر چاوەی پێشوو ، 2001 ز : 44 }

4- گوڵاو مەبەست بونی وەکو عەترە ئەو گوڵەی کە بوونی خۆش بلاو دەکاتەوە و ، وردوو بچوکە یاخود ئەو ئارەقەی گولی ناوچاوتە وەکو بۆنی گوڵ خۆشە و جوانە بێ وێنەیە لە سروشت دا .

5-

لـــــــــەبەر خەنــــدەی لــەبــی لەعلــی ئەتــــۆ بـــوو
کــــــەوا شـــەککـــەر دەربـــارەی گــوڵ دەپـــشـــکووت
{ مەحەمەد ، 2007 ز : 49 }

5- مەبەست ووشەی لێو بەمەبەستی ووشەی گوڵ ، ئەو لێوەی پر خەندەیە لێوی پێکەنین بە خونچە و کە خەندەی تێدا بێ وەکو گوڵ پشکوتووە . ئەو گولانەی لە سروشت دایە بە جۆرەها جوانی و رازاوە بەدیار دەکەوێت بە هەموو رەنگ و بۆنی خۆشەوە رەنگ دانەوەی لە شیعر دا هەیە و شاعیر باسی لێوە کردووە .

6-

گــــــوڵ هاتــــــەدەری لافــــــی لە حوسنــــــی بــووتی مــــادا
لـــــــەرزی قـــــەدی بـــــەرزی لە رقــــە زولفی کـــــە بـــادا
{ گەردی ، 2011 ز : 53 }

6- واتە لێرە دا دەبینین کە نالی هەموو جار دووبارە بونەوەی ( گوڵ و خونچە )ی وێنەیەکی تر دەخاتەروو تابلۆیەکی نوێ لێوە دەنەخشێنی ، جوانی و رازاوەی گوڵ دیمەنەکانی لە سروشت پێ دەدرەو شێتەوە ، لێرە دا توانا و هێزی خەیاڵ کردنی شاعیرو فراوان بوونی دیمەنەکانی سروشت گرینگی خۆی هەیە و جوانیەکی بێ وێنە لە سروشت پێشان دەدات .

-7

چـــاوی هـــەم رەنگــی گوڵــی مەستــی شەو رۆژن مـــەدام
یـــەک لە نەشکــوفتەی بەنەخـــشە یەک لە نەیلۆفــەر دەکـــا
{ گەردی ، 2011 : 122 }

7-. واتە ئەو گوڵانەی چۆن هەندێکیان بەشەو مەست و خەڵووان ، هندێکیان بە رۆژ هـەروان هەندێک گوڵ هەن لـە سێبەردا گەشـە دەکات هەندێکیتر هـەن رووی گوڵـەکانیان لەگـەل خـۆر هـەڵاتن هەڵدێ ، هـەروەها گـوڵ دوو جـوانی هەیـە ، جوانیـەک لـە نائاگـایی سـەرچاوەی گرتـوە ، لەگـەل ئـەو جوانیـە سروشتییەی لە رێگای هەستەکانمانەوە پێ ی دەگەین .

-8

بـــەزمی هـــەزارە . قـــەل فڕی ئەغیـــارە . دەوری گـــوڵ
ســـــــــۆفـــی ! بـــڕۆ . مەبـــە بە درک تـــۆ لە ئێمـــەنیی
{ مەحەمەد ، 2011 ز : 223 }

8-. دەوری گوڵ واتە دووری گوڵ ، لە بنەرەت دا ووشەی دور بە دوو جۆر دیت : یەکـەمیان : دەور ، دووەمیـان : دوور .دەوری گـوڵ بـێ بـۆ هـەزار بولبـول دەچێتـەوە کـە بـە دەوری گولەوەیـە ، بـەلام ئەگەر ( دووری گول ) بێ مەبەست لێ قەل فری ئەغیارە کە دوور کەوتنەوە ڕادەگەیەنێ .

-9

هــــــەر دارە بـــەرگ و هـــەر گـــوڵە رەنگــی خەلاتیـــیـە
هــــــەر جـــوودی نەو بـــەهارە کـــە عالەم دەکا غەنیـــی
{ هەمان سەچاوەی پیشوو ، 2011 ز : 223 }

9- واتـە لـە بـەهار دا درەختـی دارەکـان گـەڵا دەکـەن و گوڵـەکان دەبنـەوەو رەنگـی دەگـرن کـە خـەلاتی بـەهارە ، هـەروەها کـە دار گەڵاکـەی گرتـوو رەنگەکـەو جوانیەکـەی بـۆوە بـە خـەلات بـۆ جـوودی نـەو بەهار کە ئەو خەلاتەی لە سروشت و بەهار دایە هەر بۆ درەخت و گوڵە .

- 10

دەم هـــــەم دەمـــی خونـچەیەکە نەپـشکوتـووە هێشتا
بـــا کەشـــفی نـــەکرد بـــەرگی عەتر پۆشی گوڵـی رووت
{ شاویسی میکائیلی ، 1391 : 157 }

10 – واتـە وەک خونچـەی نەپشـکوتوو نەکراوەیـە ، هـەروەها مەبەسـت ئـەو خەنچـە نەپشـکوتووە جوانـەی کـە لەگـەل بـاوە بـە هـەموو لایەکـەوە دێت و دەچـیِّت ئـەو پـەرە ناسکەی کـە بۆنی گولی گرتووە و ،لە دوایی دا وردە وردە دەبێت بە گوڵ .

-11

وەرە نێـــــو بـــەزمی گـــوڵـــزاران و گـــۆلزاران ، تـەماشاکە
ســـەراســـەر پێـکـــەنیـــنی گـوڵ ، لەبا لەب خەنچە پشـکووتن
{ هەمان سەچاوەی پیشوو ، 1391 : 338 }

11- واتـە گـولزاران مەبەسـت ئەوانـەی دەمیـان وەکـو گـوڵ جـوانن بـۆن خـۆش و نـازدارە ، خونچـە پشکوتوو دەم کراوە ، لە هەموو لایەک دا پشکووتنی خونچە لە دوایی دا بون بە گوڵ .

– 12

دونیـــــا کـــە گـــوڵ گـــولی بـــووە ، قـــوربان ، ئـــەتۆش وەرە
تـــالیـــب بـــە گـــوڵ بـــە ، قەیـــدی چیـە گـــــوڵ گوڵی بویَ
{ هەمان سەچاوەی پیشوو ، 1391 : 705 }

12- واتە گولێکی زۆر یەک پارچە بووە ، کاتێک باسی گوڵە جوانیەکی بێ وێنـەی هەیـە بۆ دیتنی ئـەو گۆلانەی کە لە سروستدا هەن بۆن خۆش و جۆرەها رەنگ بلاو دەبنەوە .

# گوڵی ئاتەشی

-1

وەک گـــــوڵی ئاتـــەشی ، خەملێـــوە بەبـەرگی چەمـــەنی
قـــــــــــامەتی نــــــارە بەرە ، نـــار وەرە ، نـارە وەنە
{ شاویسی میکائیلی ، 1391 : 533 }

1- گولی ئاتەشی گولێکی جوان و ڕزاروەیە لـە سروشـت دا گـەلاکانی و چیمـەنی سـەوز دە پۆشـن گولەکەشی ڕەنگێکی سوری هەناریە .

-2

گـــــــــەرمی و تــــەری بـــەهــــارە کە پشکۆ کـوژایـەوە
پـــــشکـــۆی گــــوڵە ئاتـــەشین بە نەسیم بوو گەشــــایەوە
{ عارف ، 2009 : 792 .}

2- گوڵە ئاتەشین وەک گوڵی ئاگری سور بـە کاردێت لەگـەل دەسـت پێ کردنـی وەرزی بـەهار دا دەبێت و کاتێک کە کەش و هەوا دەکۆرێت و ، درەختی گوڵ ئاتەشین پێ دەگات و غونچـە دەگرێت و ووردە ووردە پەرەکانی لێ جیا دەبێتەوە دەبێت بە گولێکی سور .

## گوڵی لاله

3-

رەیـــــــــاحین پـــەرچەم و لاله کولاه و یاســـەمەن تـوررە
بنـــــەفشـــە خالّـو نێرگس چاو و گوڵ زار و سەمـــەن ساقـــە
{ خەزنەدار ، 2008 : 92 }

3- لاله گوڵێکه گوڵێکی بچوکی کیویه زیاتر لـه شـێوینی شـێدار دا ئـەروێت ، مـالیش ئـەکری گوڵی لاله لەسەرەتا له مانگی بەهار پێئەگات و جۆرە کیویەکەی گوڵێکی سوری هەیە .

4-

نــــرگس بیـــگەە و ساق و ســـەمەن ، کورتە بەنـــەخشـــەن
مـــو سونبـــــول و ، رووت گـــوڵ و هـــەم لاله کولاهـــن
{ حەمە ، 2001 : 50 }

4- لاله : مەبەست له لالەی سورە بۆ بەرجەستە کردنی ئـەو سـوریە زیـاتر جوانتر دەرخسـتنی و تەواو کردنی ئەو چەپکە گوڵەی بە شێوەی گوڵی لالەی پیشان داوە .

5-

لالـــــە مـــەجمـــەریکە بەبـــا خۆش و گـــەش دەبێـــت
نـــاوی کە پـــڕ خەڵـــووزە بەشـــــەبنم گەشـــایـــەوە
{ مەلا کریم ، 1390 : 454 }

5- گوڵی لاله کە نالی باسـی دەکـات لـه دیمـەنێکی گشـتی وەرزی بـەهار دا دەسـت پێ دەکـات گۆڕانی کەش و هەوا بخرێتەروو ئاماژە هـەبێت لێرە دا کوژانـەوەی پشـکۆیە و نـەمانی ئـاگرە ، لالـەش خونچـە دەر ئەکات و وورده وورده پەرەکانی لێ جیا ئەبێتـەوە و دەبێ بـە گـوڵ ، کرانـەوەی پـەرەی خونچـەو بوون بە گوڵی سور .

# گوڵی نەرگس

6-

نـــــەرگس و نیـــگاه و ســـاق و سەمەن ، کــورتە بەنەخشـــە
مـــوو سونبـــول و ، روومەت گــوڵ ، هـــەم لالە کولاهـــــن
{ عارف ، 2009 ، 934 }

6-نەرگس گولێگی جوان و دڵ فرێنە لە سروشت دا گولێکە لەو گولانەی لە وەرزی زستان بەسەر دەجێت و جوانی گولی نەرگس لەگەل هاتنی گەرمی وەرزی بەهار دەبێت و سروشتی بەهاری پێ دەگەشێتەوە .

7-

نـــەجم و شـــەجەر و نـــــەرگس و ئـــەنواری شکـۆفـــــە
جـــیلوە چـــەمـــەنن یەعنی زەمین بـــوو بە ســـــەمـــاوات
{ شاویسی میکائیلی ،1390 : 113 }

7-واتە نەرگس گەلاکەی زۆر بەرز نیە و گولێکی جوانی هەیە رەنگی گولەکەی سپییە ناو چاوەکانی زەردن لەگەڵ پەیدا بوونی نیشانەی هاتنی بەهاروو نەورۆزە مایەی هاتنی سەری ساڵی کوردیە .

## گولی نەرگس

8-

رەیـــــــــاحیــن پــەرچەم و لا کولاوە یـــاسەمــەن تـــورِڕە
بــــەنــەخشە خـاڵ ە نەرگس چاو و گوڵ زارو سەمــــەن ساقــــە
{ خەزنەدار ، 2008 : 92 }

8- نــەرگس : جـوانی گـوڵی نــەرگس و رەنگیینــی چاوەکـانی نێرگـز جوانەیــەکی بێوێنــەیە و بـاغ و گوڵزارێکی پڕ لە گوڵی خولقاندووە ، هەروەها بوونی گولی نێرگز جوانیەکی بێوێنەیە کە سروشت و بەهاری پێ دەگەشێتەوە .

9-

دیـــــدەت وەکــو گـــوڵ سورە بـــەری شەونمـــی ئەشـکە
یـــــــا لالـــەی بـــرژاڵە بە دوو نـــــەرکسی شەهــــلات
{ حەمە ، 2001 ز : 17 }

9- نەرکس مەبەستی لە چاوی جوانی نەرکس لـە هەندی ناوچـەی شاخاوی دەروێت گولێکی سپییەو ناوەکەی زەردە و بۆن و بەرامێکی تایبەتی هەیە لەوەرزی بەهار پێدەکات .

10 –

فـــــــــــەرشـــــی کـــــــەففـــی بـەری پێتــە نــەرگـس
ســــــــەری داخستـــــــــــووە وەک چـــــاوی حــەیــا
{ شاویسی میکائیلی ، 1391 : 122 }

10- واتە گوڵی نەرگس گولێکی جوان و بۆن خۆشـە چـاوە زەردەکـەی لـە بـەهار هەڵدێنی و گولیکی سپی دەگرێت و باڵای زۆر بەرز نیە و لە ماڵ و هەروەها لە باخچەکانیش داهەیە .

-11

وەک تـــوررەیـــی پێچـــیدەیـــی تۆ ساغ و شکستەم
وەک نـــەرگسـی نـادیدەیـی تـۆ خـۆش و نـــەخۆشـم
{ هەمان سەرچاوەی پێشوو ، 1391 : 291 }

11- واتـە گـولی نـەرگس مەبەسـت چـاوی مەسـت  وەک نـەرگس پشـکووتوو بـۆن خـۆش گولێکـە لـە وەرزی بـەهار دا دەگەشـێتەوە و چـاوی زەردو  گولەکـەی سـپییە و گەلاکەی سـەوزەو لـە سروشـت تەنها لە وەرزی بەهار دا جوانیەکەی دێتە بوون .

– 12

ســــــۆفی خـــەڵـــوەنشیـن بـۆ نـەزەرێکی گـــوڵـی رووت
رەنــگ وەک نـــەرگسـی تـــەر چـــاوی سپـــی بێـــت و دەرێ
{ هەمان سەرچاوەی پێشوو ، 1391 : 657 }

12- مەبەست لە گوڵی نەرگس ئەو خالە سپییەیە کە گولەکەی سپییە و چاوەکەی زەردە و گەلاکەی سەوزەو لەوەرزی بەهار دا دەبوژێتەوەو گولی نەرگس دەگرێت .

# گوڵی هێرۆ

-13

نـــــــەمبیســـتـــووە هـــەرگیز لەدەمـــت بیـــنی وەفایـــــی
هـــــــەرچەنـــد ســـەراپا گوڵی ئەمـــــما گـــوڵی هێـــــرۆ
{ شاویسی میکائیلی ، 1391 : 397 }

13ـ بێن ، بۆن : بە واتای گولی هێرۆ دێت گوڵی هێرۆ گولێکە رەگ و ریشەی بە ناخی زەوی دا دەچێتە خواری گولێکە بۆنی هیچ نیە و ، بەڵام بە دیمەن زۆر جوانە و چەند رەنگی هەیە و ، گۆڵە هەرمەڵەشی پێ دەڵێن .

-14

نـــــــەمبیســـتـــووە هـــەرگیـز لەدەمـــت بینـــی وەفایـــــی
هـــــــەر چەنـــــدە وەرە ـا ئـــەم غـەزەلە تـازە لەبەر کـەین
{ هەمان سەچاوەی پێشوو ، 1391 : 317 }

14-ـ بێن مانای گوڵی هێرۆیە لە دێرە شعری پێشوو هاتووە باسی گوڵی هێرۆمان کردووە ، کە هێرۆ گولێکی جوانەو بۆنی نیە و ریشەی بە ناخی زەوی دا دەچێتە خوارەوە ، بە دیمەن زۆر جوانە هەموو رەنگێکی هەیە پێ ی دەڵێن گوڵە هەرمەلە .

## گوڵی سەمەن

15 –

نـــــەرگس و نیـــگاه و ســـاق و سەمەن ، کـــورتە بەنەخشـــە
مـــوو سونبـــول و ، روومەت گـــوڵ ، هـــەم لالە کولاهــــن
{ هەمان سەچاوەی پێشوو ، 1391 : 351 }

15- سەمەن گولێکی جوانە و بالای زۆر بەرز نیە و ، گولەکەی پێی دەلێن سەد پەرە ، رەنگێکی نەوشەیی هەیە .

16 –

تـــەنهـــایی ســـەمـــەن بـــەرگی بنـــەوشە کـــەلەبـــەر کەن ،
وەک نـــوری دڵـــی مـــوئمـــین و زولمـــاتی گـــوناهـــن
{ هەمان سەچاوەی پێشوو ، 1391 : 353 }

16- واتە سەمەن گولێکی جوانە کە پێی دەلێن سێ پەرە ، سەد گەلایی هەیە ، جۆری گۆلەکەی سێ رەنگی هەیە ، درەختێکە بالای سپی و کورتە گولەکەی ڕەنگ وەنەشەییە .

17 –

لـــــە خـــەزان بـــێ خـــەبـــەرە بـەرگی بـەهارو چـەمـەنی
بـــێبەقـــایی گـــــوڵ و ســـەرو ســـەمـــەن و یـاســـەمـەنی
{ هەمان سەچاوەی پێشوو ، 1391 : 674 }

17- سەمەن گولێکە چەند رەنگێکە هەیە بالای سپی و کورتە سەوزە درەختێکی بەهاریە و چیمەنی جوان و سروشتی دەدرەوشێتەوە ، کاتێک وەرزی پایز هات گول و سەمەن یاسەمەن هەموو سیس ئەبن و ئەوەرن .

**ئەنجام : -**

**لە کۆتایی ئەم لێکۆلینەوەیە گەیشتینە ئەم ئەنجامەی خوارەوە :**

1-ـ سروشت رەنگدانەوەی زۆری هەبووە لەسەر شاعیران لەمەبەستی شیعـــریەکانیان دا ، هـەروەها نالیش بەهەمان شێوە یەکێک بووە لەو شاعیرانە کە باسی لە جوانی سروشت کردووە.
2-ـ لە نێو سروشت دا بە بێ جیاوازی چەندین جار ناوی گوڵی هێناوەو جۆرەکانی گولیش لەگەڵ دا وەکو ، نەرگس ، لالە ، هێرۆ ، یاسەمەن ...... هتد
ئەمەش وای کردووە لەگەل سروشت و جیاوازی هەر گولێک جوانی و تایبەتمەندی هەر یەکیان بەهێزترین و جوانترین مەبەست بگەینێ .
3-ـ نـالی مامەڵەیـەکی رووکەشـانەی لەگـەڵ سروشـت و گـوڵ دا نـەکردووە ، بـەڵکو چۆتـە نـاو نـاخ و دەروونی کاریگەریانە بەکاری هێناون .
4-ـ نالی لە شیعرەکانی دا ئەو زمانـەی کـە شـیعری پـێ نووسـیوە تێکـەلاو بـووە و ووشـەکاری بـەکار هێنـاوە ، بـەلام زمانیـە کوردیـە شـیرینیەکەی بـە زمـانێکی روون و رەوانـە لـە هـەموو جۆرەکـانی گـوڵ دواوە ، هاوئاستی کردووە لەگەل مەبەستە شیعریەکەی خوێنەی بە ئاسانی لێ تێبگات .
5-ـ هـەروەها نـالی وێنەیـەکی شـیعری نـاوازەی بـە جۆرێـک بـە گـوڵ دروسـت کـردووە تـەنها خـەیاڵ دەتوانێت پەی پێ ببات .
6-ـ ئـەم شـاعیرە مەزنـە زۆر جـوان و هونەرمەندانـە گوڵی هـەم وەکو مەبەسـتەکان بـەکار هێنـاوە و ، یاخود وەکو سروشتی جوانی و رازاوەیی بە کار هێناوە .

## لیستی سەرچاوەکان  بە کوردی  : -

1-  ئەحمەد ، مەلا خدر ( 1391 ) دیـوانی نالی،  چاپی هەشتەم.

2- مەلا کەریم ، محمد ( 2009 ) نالّی لە کلاّوو رۆژنەی شیعرەکانیەوە، بەرگی دووەم.

3- مەحەمەد  ، مسعود ( 2007 )، چەپکێک لە گۆلزاری نالّـــــی، چاپی دووەم.

4- مەحەمەد ، ریبوار ( 2016 )، نالّی و سایکۆلۆژیایی شیعر داهێنانی شیعری نالّـــی، چاپی رۆژ هەلاّت / هەولێر ،  لە روانگەی رەخنەی دەروونی و میتۆدی دەروونشییکارییەوە .

5- نوری ، عارف ( 2009 )، فەرهەنگی دیوانی شاعیران ( نالی و سالم و کوردی )، چاپی دووەم.

6-  مەحەمەد ، مسعود ( 2007 )، دەستەو دامانی نالّـی، چاپی دووەم.

7- مجید ، فازیل  ( 2007 )، سروشت لە شیعری گۆران دا، چاپی یەکەم.

8-  ابراهیم ، مەشخەل ( 2016 )،  دیوانی نالی.

9 - نەقشبەندی ، ئەیوب ، تێکەلاّوی زمانی شیعری نالی لەگەل شاعیرانی فارسدا .

## نامەی ماستەر : -

1-   ئەحمەد ، هیتلەر ( 2001 ) ، وێنەی  شیعری لای نالّی.

2 -  مەحەمەد ، ریبوار ( 2011 )، داهێنانی شیعری نالی  لە روانگەی رەخنەی دەرونشیکارییەوە.